زنجیرەی مێژوو بۆ لاوان (18)

# ئادەم سمیس، ماڵتۆس، مارکس

تیرینس بایریس

و: ئاگری ئەفشین

2018

(١٨)زنجیرەی مێژوو بۆ لاوان

ناوی کتێب: ئادەم سمیس،ماڵتۆس، مارکس

نووسەر: تیرینس بایریس

و. لە فارسیەوە: ئاگری ئەفشین

ساڵ: 2018

چاپ: ئەلکترۆنی

**ناوەڕۆك**

# پێشەکی

سێ کە سایەتی کە لەم نامیلکەیەدا دێنە باس کردن، نوو سەر و بیرمەند بوونە" واتە کە سانی خاوەن فکر بوونە. مێژوو تەنها چـیرۆکێك نیە لە بارەی ئەوەی کە خەڵك چـیان کردووە، بەڵکۆ باس لەوەش دەکات کە چـلۆن بیریان کردۆتەوە. کەســانی وەکوو سمیس، ماڵتۆس و مارکس ئەوەندە بیروکەی گرنگیان هەبووە کە لە دوای خۆیان کاریگەری گەورەیان لە سەر خەڵکانی دیکە جێهێ شتووە. بیرۆکەکانیان لە بواری گۆڕانگاری گەورەیە کە جیهانی سەردەمی لێ وەدیهاتووە. نامیلکەکانی دیکەی ئەم زنجیرەیەی وەکوو ( شۆڕ شی پیـ شە سازی، شۆڕ شی کـ شتوکاڵی، شۆڕ شی زانـ ستی) باس لەم گۆڕانکاریانە دەکەن. هەموو ئەم نامیلکانە باس لە دەست ڕۆشتووی مرۆڤ دەکات بۆ سەرچاوە سروشتیەکان کە زۆرترین سامانی لێ وەدە ست دەهێنن. داهێنان و دابەش کردنی سامان دوو بنەمای بنـ چینەین لە بابەتێکدا کە پێی دەوترێت ئابووری. سمیس، ماڵتۆس و مارکس هەر سێکیان ئابووریناس بوون" بەڵام ئەوان لە بواری دیکە شدا بیرمەند و زانا بوون. بۆیە دەتوانین بڵێن ئابووریناس-سیاســەتمەدار بوونە. هەوڵ و تەقەلای ئەم ســیانە ئەوە بوو کە تەفســیر و شــیکاری بۆ سیستەمی کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیا سی جیهانی نوێ بکەن و ئەگەریش کرا پێش بینیەك بۆ گۆڕانکاریەکانی داهاتوو بکەن.

ئادەم سمیس

شاری گلاسکۆ کە ئادەم سمیس لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەم دەیناسی.

## ئادەم سمیس (١٧٩٠- ١٧٢٣)

ئادەم سمیس لە  ساڵی ١٧٢٣ لە کیرکودی ( سکۆتلەندا) لە خێزانێکی کارمەندی گومرگ لە دایك بووە. سمیس قۆناغی سەرەتایی لە وڵاتی خۆی تەواو کرد و یۆ خوێندنی باڵاش  سەرەتا ڕووی کردە گلا سکۆ و دواتر  چوو بۆ ئۆکسفۆرد, دوای چەند ساڵ لە خۆێندن لە زانکۆی ئەدینبۆرگ، لە ساڵی ١٧٥٠ بوو بە مامۆستای زانکۆی گلاسکۆ. سمیس هەتا ساڵی ١٧٦٣ لە گلا سکۆ مایەوە دوای ئەوە پێگەی بەڕێوەبەری گە شتوگوزاری دوك بو کلو چی بەدە ستهێنا . ئەم پێگەیە لەو ڕۆژگارەدا کارێکی زۆر باش بوو چـونکە موچـەی خانەنشـنی زۆر لە سـەرێ بوو. ئەو لە گەڵ دوك سـەفەری ئەوروپای دەکرد و بە تایبەت فەڕانسە و  چاوی بە زۆرێك لە بیرمەندانی ئەو کات کەوت و لەوێدا دەگەڵ ڤۆڵتێر ئا شنایەتی پەیدا کرد. لە  ساڵی ١٧٦٦ گەڕایەوە بۆ ئینگلیز و سـاڵێك دواتر گەڕایەوە وڵاتی خۆی، سـکۆتلاند، و لەوێدا بۆ ماوەی ١١ سـاڵ مایەوە و لەو ماوەیدا کتێبێکی نووسی کە ناوبانگی جیهانی پێدا. ئەم کتێبە ناوی سامانی گەلانە  و لە ساڵی ١٧٧٦ چاپ کرا. سمیس لە ساڵی ١٧٩٠ کۆچی دوایی کرد.

## کاریگەری بیرۆکەکانی ئادام سمیس

ئەو کاتەی ئادەم سمیس لە ژیاندا بوو  شۆڕشی پیشە سازی بە خێرایی ژیانی خەڵکی دەگۆڕی و دەبووە هۆی پەیدابوونی بیرۆکە و داهێنانی نوێ. ئەوکاتەی کە سمیس لە گلاسکۆ بوو هەستی بە سەرەتای گەشەی پیشەسازی کردبوو و پەیوەندی لە گەڵ پیشـــەوەران و بازرگانەکان هەبوو. سمیس ئاگاداری دەرکەوتنی ســـەرمایەداری بوو، بەوردی بیری لە بارودۆخی

گەشەی سەرمایەداری دەکردەوە. کاپیتالیسم، واتە سەرمایەداری، بەو سیستەمە ئابووریە دەوترێت کە تێیدا سەرمایە (یان کاپیتالّ)، وەکوو پارە، کارخانە، ئامرازی کار، هەموو لە دە ستی کە سانی سەرمایەداردان کە ئەوان لە بارەی چۆنیەتی بەکارهێنانیان بڕیاردەدەن. لە نێوان ئەم سەرمایەدارانە و کرێکارەکانی کە لە کارخانەکانی ئەودا کاردەکەن ناسازگاری هەیە لە سەر سوودی گشتی.

کارخانەیەکی سەدەی نۆزدەیەم لە شاری شفیلدی ئینگلتەرا

## گرنگترین بیرۆکەکانی ئادەم سمیس

هێرش کردنە سـەر مەرکەنتالیسـم یاخود سـەوداگەرایی یەکێکە لە لایەنە گرینگەکانی کتێبەکەی، سـامانی گەلان. سەوداگەرایی سیاسەتێکی ئابووری و سیاسەتی زالّ بوو لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدە لە بەریتانیا. ئامانجی ئەم سیاسەتە ئەوە بوو کە سامان و هێزی ولات زیاد بکات. مەرکەنتالیستەکان باوەڕیان وابوو کە لە ڕێگای پاشەکەوت کردنی ئالتون و شـتی گران بەها دەتوانن بگەن بەو ئامانجە. لە ڕێگای زیاتر هەناردەکردنی کالا و کەمکردنەوەی هاوردەکان دەکرا ئالتونێکی زیاتر کۆبکەنەوە، لەم ڕێکەیەوە بیلانی بازرگانی(لیستێك یاخود پێرستێکە کە نوسینگەو کۆمپانیاکان لە کۆتایی سـالّدا دارایی و قەرزەکانی خۆیانی تێدا دەنووسـنەوە) بە سـوودی حکومەت پۆزەتیف کرا. دەرکەوتنی موسـتەعمەرات کڕیاری زیاتری بۆ کالاکانی بەریتانیا دەستەبەر کرد" لە کاتێکدا دەکرا لە ڕێکای دانانی باج لە سەر کالا هاوردەکانەوە، هاوردەکەرانی کالانی بیانی ڕوو لە لاوازی بکات و لە ڕێگەی پیشـەسـازی ناوخۆیی پارێزگاری بکرێت لە دژی کێبڕکێ کارانی دەرەکی. ئادەم سمیس سیستەمی مەرکانتالیستەکانی بە تەواوی ڕەد دەکردەوە ئەویش بە بەلّگەی ئەوەی کە

**پێی وابوو ئەم سیستەمە نەك هەر نابێتە هۆی زیاتر کردنی سامانی نەتەوەیی بەڵکۆ دەبێتە ڕێگر لەبەردەم ئەم پێشکەوتنە. ئەم سیستەمە ڕێگر بوو لە نوێکاری و داهێنان، هەنگاوی پیشەسازی کە بە لای سمیسەوە گرنگترین هۆکار بوو بۆ گەشەی ئابووری، بە هۆی ئەم سیستەمەوە ئەم گەشە کردنە زۆر خاو دەبوو. لە نیزامی مەرکانتالیستەکان، تەنها کرنگی دەدرا بە هەندێك پیشە سازی دیاریکراو، واتە ئەو پیشە سازیانەی کە تەنها لە خزمەت دەوڵەمەندەکاندا بوون نەك نەدار و هەژاران. ئەمەش دەبووە هۆی پاوان کردن یان مۆنۆپۆڵ. پاوان یان مۆنۆپۆڵ واتە تەنها بوونی (یەك فرۆشـــیار) لە بازاردا، ئەمەش کاتێك سوودی لێ وەردەگیرا کە خاوەن پیشەکان پێکەوە یەکیان دەگرت بۆ ئەوەی کێبڕکێ لە نێوانیان نەمێنێت، تا لە کاتی گونجاو لە گەڵ کەم بوونەوەی وەبەرهێنان نرخەکان بەرزبکەنەوە. پاوەن کردن ڕێگری لە گەشەی ئابووری دەکرد و زیانی دەگەیاند بە سوودی بەکارهێنەران. سمیس دەیکوت دەبێ ڕێساکانی مەرکەنتالیستەکان لەناوببرێن .**

## پێویست بوون بە بازاری ئازاد

**ئەوەی ئادەم سمیس دەیهەویست (لیسە فێر) بوو، ووشەیەکی فەرانسیە واتە ئابووری بێ خۆتێ هەڵقورتان، بە دەربڕینێکی دیکە واتە (لێی گەڕێ با ئازاد بێ)، بەڵام لە دەســتەواژەدا واتە ســیاســەتی بازرگانی ئازاد. لەبەر ئەوە ســیاســەتی دەســتوەردانی حکومەت لە بابەتی ئابووری دەبێ دابەزێ بۆ نزمترین پلە. ســوودی تاکەکەســی ڕێنموونی مرۆڤ دەکات، ئەگەر ڕێگەی بدەن بۆ خۆی ئازاد بێ، بۆ ئەوەی بە دوای سوودی خۆی دا بگەڕێ، ئەوا بۆ کۆمەڵگەش زۆرترین سوودی دەبێت. بە پێی ئەم بیردۆزە، مرۆڤ لە چـــالاکیەکانی خۆی قەســـدی ئەنجامدانی کارێکی بێ بەرامبەری نیە بۆ هاوڕەنگەکانی خۆی، بەڵام لە سیستەمی ئابووری جۆرێك هاوئاهەنگی سرو شتی هەیە، وەك ئەوەی دە ستێکی شاراوە ڕێنمایی بکات. هاتنە ناوەوەی حکومەت تەقریبەن لە هەموو بوارەکان ئەم هاوئاهەنگیە تێك دەدات. ئەم بابەتە نەك تەنها کاروباری ناوخۆیی وڵاتان دەگرێتەوە، بەڵکو بازرگانی دەرەکیش دەگرێتەوە. بازرگانی ئازاد باشـــترە لە بازرگانی حکومی بۆ قازانجی هەمووان. ســیاســەتی لیســە فێر و بازاڕی ئازاد یارمەتیدەر دەبێت بۆ گەیشــتن بە لوتکەی ســامانی گەلان.**

## دابەش کردنی کار

**ئادەم سمیس لە خۆی دەپرسی کە هۆکاری باشتر بوونی سیستەمی پیشەسازی و کشتوکاڵی لە دوای شۆڕشی پیشەسازی هاتە ئاراوە لە چاو پێشتر چی بووە؟ وەڵام ئەوە بوو کە گرنگترین هۆکار دابەش کردنی کارە. دابەش کردنی کار کاتێك ڕوودەدات کە پیشە سازی دابەش بکرێت بۆ کاری جۆراوجۆر. هەر کە سێك بە شێکی بچوك لە هەموو شتەکە درو ست دەکات، وە ئەو بەشە بچۆکە دەداتە دەست کەسی دواتر کە تەواوی بکات. پێشتر کەسێك خۆی بە تەنیا هەموو شتەکەی درو ست دەکرد بەڵام بە پێی سیستەمی دابەش کردن، بە چەند کەس شتێك درو ست دەکەن و ئەمەش دەبتە هۆی زۆری ڕێژەی وەبەرهێنان و خەرجی کەمتر و خێرایی کارکردنیش زیاد دەکات. دەکرێ ئەمە لە کارخانەیەکی دەرزی دروست**

(١٩٦٠) دابەش کردنی کار

کردندا ڕوون بکرێتەوە: کە سێك کە نە ڕ سپۆڕی هەیە و نە ئا شنا شە بە ئامێرە نوێیەکان بە زەحمەت دەتوانێ ڕۆژێ یەك دەرزی دروست بکات" و هەرگیز ناتوانێ لە ڕۆژێکدا ٢٠ دەرزی دروست بکات. بەڵام ئەگەر چەند کەسێك و هەر کەسەش لە بەشێکی کارەکە زۆر زیرەك و لێهاتوو بێت، بابەتەکە ئەو کات جیاوازترە. بۆ نموونە کەسێك سیمەکە دەکێشێت" یەکی دیکە ڕاستی دەکاتەوە" سێیەمیان دەیبڕێ" چوارمیان نوکەکەی تیژ دەکات" پێنجەمیان سەرێکی ئامادە دەکات بۆ کونی دەرزیەکە، هەر ســەری دەرزیەکە خۆی چــەند نەفەری دەوێت و دواتر ســپی کردنەوەو پێچــانەوەی تەقریبەن ١٠ نەفەری دەوێ... ئەمانە بەم جۆرە و بەو لێهاتوویەی کە هەیانە ڕۆژانە دەتوانن ٤٨٠٠٠ دەرزی بەرهەم بێنن. واتە هەر کەســەو ٤٨٠٠ دەرزی لە ڕۆژێکدا, ئێستا بە خۆت بڵێ ئەگەر ئەمانە هەر کە سەو بە تەنها کاری کردبا و لێهاتووی شیان نەبا چەندیان پێ دروست دەکرا.

سێ شت بوونە هۆی ئەوەی کە دابەش کردنی کار بە ئەنجام بگات: یەك لێهاتووی زیاتری کرێکار بە هۆی زۆر دووبارە کردنەوەی کارەکەی، دوو: بە هۆی کەم کردنەوەی ســەعاتی کار و ســێهەم: داهێنان یارمەتی دەر بوو بۆ مرۆڤەکان کە یەك کەس کاری چــەندین نەفەر ئەنجام بدات. دابەش کردنی کار یارمەتیدەر بوو بۆ زیادکردنی ســامانی هەر یەك لە میلەتان، یانی سامانێك کە لە هەموو کۆمەڵگا بڵاو دەبویەوە و هەتا دەگەشتە نزمترین ئاستی کۆمەڵگاش. بەڵام دابەش کردنی کار تەنها بە سوودی یەك میلەت نەبوو لە چوار چێوەی وڵاتێك. ئادام سمیس پێی وابوو کە دەبێ ئەم سیستەمە لە پەیوەندی نیو دەوڵەتیش سوودی لێوەربگیرێ. میلەتان دەبێ بۆ وەبەرهێنان گرنگی بە پسپۆڕی بدەن و لە نێوانیان بازاڕی

ئازاد بونیاد بنێن. ئەو کات سوودە گەورەکانی دابەش کردنی کار لە ئا ستی نیودەوڵەتی دەبتە ڕا ستی. سمیس ئاماژەی بەو خاڵە کرد کە هەرچـــی بازار گەورەتر بێت واتە کڕیاری زۆرتر هەبیٚ بەهەمان شـــێوە هەماهەنگی و ئاڵوگۆڕکردن بەرفراوان دەبێت و دابەش کردنی کار زیاتر گونجاوتر دەبێت. بە بڕوای ئەو باشـــترین ڕێگە هەمان ئاڵوگۆڕکردنی بازرگانی ئازاد بوو.

سەرمایەدارە ئەمریکیەکان کە لە کۆتایەکانی سەدەی نۆزدەیەم لە ڕێگەیەی مۆنۆپۆڵەوە خۆیان دەوڵەمەند دەکرد

## هەندێك یادەوری

لە گەڵ هەموو ئەمانە، ئادەم سمیس ئاگاداری هەندێك بابەتی ئابووری بوو کە لە سیستەمی نویٚ لە پێش چاوی گەشەیان دەکرد. چاوەڕوانی زۆری لە بازرگان و پیشەوەران نەبوو، دەیزانی کە ئەمانە گەلێك موشتاقن کە نرخەکان بەرزبکەنەوە و حەق دەســتیش کەم بکەنەوە، هەرکاتیش بۆیان هەڵکەویٚ ســیســتەمی پاوەن کردن دەخەنە کار. لە ڕوانگەی ئەوەوە پاوەن کردن، شتێکی لۆمەکراوی کۆمەڵایەتی بوو، و دەبوایە لە ڕیە شەوە هەڵکەندریٚ. سامانی گەلان و سوودی گ شتی هەموو کۆمەڵگا لە ڕێگای بازرگانی ئازادەوە بە باشترین شێوە مسۆگەر دەبیٚ .

## گرنگی بەرهەمەکانی ئادام سمیس

ئادەم سمیس لە مێژووی جیهان لە دوو ڕووەوە گرنگی هەیە: ئەو یەکەم کەس بوو تایبەتمەندیە سەرەکیەکانی سەرمایەداری شی کردەوە، واتە ئەو سیستەمە سیاسی و ئابوریەی کە لە سەدەی نۆزدەهەم بە هێزێکی تەواو لە ئەوروپای ڕۆژئاوا و ئەمریکای باکوور جێگیرکرا و کاریگەری گەورەی کردە سەر جیهانیش بە گشتی. بیرۆکەکانی سمیس بۆ خاوەن پیشە نوێیەکان مایەی خۆشحاڵی بوو و ئەمانە بە هاوکاری پیاوانی دەوڵەت نیزامی مەرکانتیستەکانیان لە ناوبرد و لە جیاتی ئەوە بازاری ئازاد و لیسە فێریان بونیاد نا. لە مێشکی هەندێك لە سەرمایەدارانی وەکوو ڕیچارد کابدین مانچستەری، مانای بازرگانی ئازاد زۆر زیاتر بوو لە نیزامێکی بازرگانی" ئەم سیستەمە بۆ ئەو ئارمانجێکی گەورە بوو ڕەونەقێکی ئابووری و ئاشتی نێودەوڵەتی وەدی دەهێنا. دووەم ئەوەی کە ئادەم سمیس بونیادنەری سەرەکی زانستی ئابووری بوو. گەرچی بەر لە ئەو کەسانی دیکەش لەم بارەوە شتیان نووسیوە، بەڵام نوسینەکانی ئەوان بابەتی دیکەشی تێکەڵ دەکرا. ئادەم سمیس بوو کە بۆ یەکەم جار شوێنگەیەکی جیای دا بە زانستی ئابووری .

## تۆماس ڕابێرت ماڵتۆس (١٨٣٤-١٧٦٦)

تۆماس ڕابێرت ماڵتۆس لە ساڵی ١٧٧٦ لە خێزانێکی مام ناوەند لە نزیك درکینگ لە ئینگلتەرا لە دایك بوو. ماڵتۆس خوێندنی سەرەتایی زیاتر لە ماڵ تەواو کرد، و دواتر لە ساڵی ١٧٨٤ چوو بۆ زانکۆیی کەمبێرج. لەم زانکۆیەدا ماڵتۆس سەرنجی چووە سەر شتی جیاواز بەتایبەت زانستی بیرکاری. لە ساڵی ١٧٩٦ بەرگی ڕۆحانیەتی پۆشی. سەفەری زۆری بە وڵاتانی ئەوروپای دا کرد و شەوقی زۆری بۆ شتەکانی دەوروبەری هەبوو. کتێبێکی نووسی کە بە هۆیەوە ناو بانگی دەرکرد. ئەم کتێبە ناوی (لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی بنەماکانی دانیشتوان) بوو کە لە ساڵی ١٧٨٩ چاپ کرا. لە ساڵی ١٨٠٥ بووە بە مامۆستای ئابووری سیاسی و مێژوو لە کۆلێجی هیلی بری و تا کۆتایی ژیانی لەوێدا مایەوە. ماڵتۆس لە ساڵی ١٨٣٤ کۆچی دوایی کرد .

ماڵتۆس

## ماڵتۆس و بیردۆزی پێشکەوتن

لە نامیلکەکانی دیکەی ئەم زنجیرەیە (سـەردەمی ڕووناکبیری و شـۆڕشـی فەڕانسـە) دەتوانی ئاشـنا بیت بە ئەوروپای سەدەی هەژدەیەم. لەو سەدەیەدا بیردۆزی پێشکەوتن هەمووانی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو. تا بەر لە سەدەی هەژدەیەم خەڵك جیهانیان بەو شێوەیە کە دەبینی قەبوڵیان دەکرد، بەڵام بە درێژایی سەدەی هەژدەیەم هەستێك لە خەڵکدا دروست بوو کە بیریان لەوە دەکردەوە جیهان بکەنە شـوێنێکی باشـتر بۆ ژیان. بەڵگەکانیان ئەوەبوو کە ئەم دامەزراوانە، وەکوو دەوڵەتەکان بەزەبر بۆ خەڵکی. کەوابوو ئەگەر کرابا ئەم وڵاتانە گۆڕانیان بەسـەرهاتبا، ئەوا دەکرا گۆڕانی سـروشـتی مرۆڤایەتی مسۆگەر دەبوو. مرۆڤەکان دەیانتوانی بێ کەم و کورتی بژین. زۆرێك لە نووسەران ئەم بیرۆکانەیان وروژاند، لەوانە نووسـەرێکی ئینگلیزییوو بە ناوی ویلیام گادوین( ١٧٥٦-١٨٣٦). ئەم بیرۆکا نە بوونە ئیلهامێك بۆ زۆرێك لە شۆڕ شگێڕانی فەڕانسە و خەڵکی ئا سایش کە لە هەژاری و نەداریدا دەژیان. بەڵام ماڵتۆس لە کتێبی دانیشتوان بە زۆری باس لە بیردۆزی پێشکەوتن دەکات .

## بیردۆزەکانی ماڵتۆس

ماڵتۆس لە ڕوانگەی ئابووریەوە لە ڕەشـبینەکان بوو، واتە باوەڕی بەوە نەبوو کە بتوانرێ بارودۆخی جیهان باشـتر بێ، هۆکاری ئەم ڕە شبینیە شی بیرۆدۆزی دانی شتوان بوو. بە پێی ئەم بیردۆزە گە شەی دانی شتوان هەمی شە زیاترە لە ڕێژەی خۆراکی ئەنبارکراوە. دەکرێت بیرۆدزی ماڵتۆس بە پێی یاسای ڕەوتی هەندەسی ڕوون بکرێتەوە: (واتە ژمارەی دانیشتوان بەم جۆرە گەشە دەکات: ١، ٢، ٤، ٨ ...هتد و لە کاتێکدا پاشەکەوتی خۆراك بەم جۆرەیە: ١، ٢، ٣، ٤، ٥ ...هتد) .

دیارە کە بارودۆخێکی لەم جۆرە بەردەوامی نابێت" خەڵك بۆ زیندوو مانەوەیان پێویسـتیان بە خۆراك هەیە. کەوابوو ماڵتۆس بەڵکەگەی ئەوە بوو کە لە جێگایەك خۆراکی نەمرنەژی هەیە، واتە بەشـە خۆراکێك کە تەنها بتوانن پێی بژین، دەکرێ لە نێوان خۆراکی پاشەکەوت کراو و ژمارەی دانیشتوان هاوسەنگیەك دروست بکرێت، و ئەگەر نەکرا، ئەوا شوێنی پێویست بۆ هەمووان مسۆگەر نابێ. حسابیان کردووە کە ئەگەر لە ساڵی دە هەزاری پێش زایین تەنها دوو کەس لە سەر زەوی ژیابان، و ڕەوتی دانیشـتوانیش بە ڕێژەی لە سـەتا یەك گەشـەی کردبا( واتە بە ڕەوتێکی کەمتر لەوەی ماڵتۆس مەبەستی بوو) دانشتوانی ئێستای دونیا ئەوەندە زۆر بوو بە ئەندازەی چەندین ساڵی نووری .

دیارە کە ژمارەی دانیشتوان بە ڕەوتی یەك دەرسەدیش گە شەی نەکردووە، بۆچی؟ بە بڕوای ماڵتۆس ئەمە دوو هۆکاری هەیە: بێ چارەیی و چەپەڵی. مەبە ست لە بێ چارەیی جەنگ و نەخۆ شی و قاتوقڕیە. و مەبە ستیش لە چەپەڵی دە ست تێوەردانە لە کرداری ئا سایی جن سی ژن و پیاو، وەکوو هاوڕەگەزبازی و پێ شگیری لە دووگیان بوونە. بە بڕوای ماڵتۆس بێچارەیی و چەپەڵی بە درێژایی مێژوو ڕێژەی دانیشتوانیان ئەوەندە کەم کردۆتەوە کە گەشتۆتە ئەو ڕادەیەی کە خۆراکی پاشـەکەوت کراو کافی بێت بۆ ئەو ڕێژەیە. و ئەو کات، ئەم بابەتە لە داهاتوشـدا ڕوودەدات. بۆ نموونە وادابنێ کە بارودۆخی خەڵکی باشـتر بێت، لەم حاڵەتدا هاوسـەرگیری لە تەمەنێکی خواتر ڕوودەدات" خێزانی زۆرتر پێك دێت" ژمارەی دانیشـتوان خێراتر گەشـە دەکات، کەوابوو ئەو خۆراکەی هەیە لە نێوان ژمارەیەکی زیاتر دابەش دەکرێت، و بە خێرایی بارودۆخی خەڵکی دادەبەزێ بۆ نزمترین ئاسـت. لە ڕوانگەی ماڵتۆسـەوە، ئەم بنبەسـتە تەنها یەك ڕێگای

دەرچـوونی هەیە: ئەگەر خەڵك درەنگتر هاوســەرگیری بکەن و مناڵیان کەمتر بێت، گەشــەی دانیشــتوانیش لە خوراکی پاشــەکەوتکراو کەمتر دەبێ و هەمووان دەتوانن لە بارودۆخێکی چــاکتردا بژین. بەڵام بڕوای نەبوو کە هەمووان بتوانن ئەم کارە بکەن. ماڵتۆس بۆ خۆی تا تەمەنی ٣٩ ساڵان هاوسەرگیری نەکرد، بەڵام دواتر بوو بە خاوەنی ١١ کچ !

تاعون نەخۆشیەك بوو کە لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەیەم هەزاران هەزار خەڵکی لە ئینگلتەرای لە شارە پیشەسازیەکان کوشتوە

ئەم بیردۆزە گورزێکی قور سی بەوانە گەیاند کە باوەڕیان بە پێ شکەوتن هەبوو، و هۆکارەکە شی ئا سانە. لەبەرئەوەی بە پێی ئەم بیردۆزە باشترکردنی ژیانی خەڵك هیچ سودێکی نییە، چونکە (ئەسڵی دانیشتوان) دووبارە خەڵکی دەگەڕێنێتەوە سەر هەمان خاڵی سەرەتا. لە سەر بنەمای بەڵگەکانی ماڵتوس، بیردۆزەکانی کومونیستی، بە تایبەت وەکوو بیردۆزەکانی گادوین، مالتۆس بە چەپەڵی دەزانین. لە سیستەمی گادویندا، منداڵیان دەدایە دە ست کۆمەڵگا نەك دایك و باوکەکان، خەڵکی هاندەدران کە منداڵی زۆرتریان هەبێت. ماڵتۆس بڕوای وابوو کە دەبێت خەڵك وادار بکرێت سەربەخۆبن و بە بێ دە ستێوەردانی حکومەت، خەڵك خۆیان کاروبار و چاوەدێری مناڵەکانیان بگرنە ئە ستۆ. ئەگەر خەڵك لە سەر پێی خۆیان بوەستن، ئەوکات هەست بە مەترسی منداڵبونی زۆر دەکەن. کەوابوو، ماڵتۆسیش لایەنگری بیردۆزی لیسە فێر بوو.

## یاساکانی دژە هەژاری

ماڵتۆس بیردۆزەکانی خۆی لە گەڵ یاســاکانی دژە هەژاری گونجاند. (واتە ئەو یاســایانەی کە بۆ ڕۆبەڕوبونەوەی بابەتی هەژاری دەرکرابوون) بە بڕوای ئەو هەژاری خەڵك بە هۆی چــەند شــتێکەوە بوو لەوانە، زۆر پیری یان زۆر لاوی، یان زۆر نەخۆش بوون کە نەیان دەتوانی کار پەیدا بکەن، یان ئەگەر کاریان هەبوایە، موچــەکانیان کافی نەبوو. بە درێژایی ســەدەکانی ڕابردوو هەوڵی زۆر درابوو بۆ ڕووبەڕوبونەوەی هەژاری. لە کۆتایەکانی ســەدەی هەژدەیەم لە ئینگلتەرا ســیســتەمێك هاتە ئاراوە کە یارمەتی دارایی ئەو کەســانە دەدرا کە بێکار بوون، یان جیرەیان دەدا بەوانەی کە حەق دەستیان کەم بوو. بە بڕوای ماڵتوس، ئەم سیستەمە زۆر خراپ بوو، چونکە ئەم سیستەمە خەڵکی تەمبەڵ دەکرد و ڕێگەی نەدا خەڵك بیر لە خۆیان بکەنەوە و خۆیان بە خێو بکەن، ئەوکات خەڵك خێزانی گەورەتریشــیان دروســت دەکرد. بە بڕوای ئەو دەبوایە یاساکانی دژە هەژاری گۆڕانی بەسەرهاتبا .

کاتی خواردنی نانی نیوەڕۆ لە یەکێك لە نانەواخانەکان لە سەدەی نۆزدەیەم

لە ناو ئەوانەی کە لە حکومەتدا کاریان دەکرد کەسانێك هەبوون کە گوێیان بۆ ماڵتۆس دەگرت. لە هەمان ساڵی مردنی ماڵتۆس واتە ساڵی ١٨٣٤، تەواوکەری یا سای دژە هەژاری چووە بواری جێ بەجێکردنەوە و تا کۆتای سەدەی نۆزدەیەم کاری پێکرا. ئەم سیستەمە لە سەر بنەمای یا سای نانەواخانە( نانەواخانە، خانویەك بوو کە بە پارەی دەوڵەت کە سانی هەژاریان تێدا بەخێو دەکرد) کاری دەکرد. چیتر خەڵك نەیاندەتوانی لەماڵەکانیان دانیشن و جیرەش وەربگرن. ئەگەر کە سێك توانای خۆبەخێوکردنی نەبوایە، دەبوایە چوبایە بۆ یەکێك لە نانەواخانەکان کە لەوێدا بارودۆخ زۆر خراپتر بوو لە دەرەوە. ئومێدیان هەبوو کە لەم ڕێگەیەوە بتوانرێ خەڵکی لە چــاڵی هەژاری بکێشــنە دەرێ. پیاوان دەبوایە هەوڵ دەن کارێك پەیدا بکەن و هەتا نەتوانن خێزانێك بەرێوەبەرن هاوســەرگیری نەکەن. یاســاکانی دژە هەژاری لەســەر بنەمای

**بیردۆزەکانی مالتۆس بوون، کە ئەم یا سایانە بە کار دەهات بۆ ڕێگری کردن لە هەر جۆرە چاک سازیەکی کۆمەلایەتی، لەوانە یاسای حەق دەستی کەم و دروستکردنی خانوو بۆ منالانی بێ سەرپەرەشت .**

**بیردۆزەکانی مالتۆس لە بواری دیکەشـــدا کاریگەری هەبوو. بەتایبەت زانســـتی ســـروشـــتی. چـارلز داروین لە نوســـینی کتێبەکەی ( سەرچاوەی چەشنەکان) لە بارەی بیرۆدزی پەرەسەندن تا ڕادەیەك قەرزاری مالتۆسە. ( بگەڕێەوە بۆ داروین لەم زنجیرەیە)**

## **مالتۆس و مێژووی جیهان**

**ناوەڕۆکی سەرەکی بیردۆزی مالتۆس هەلە دەرچوو. گەشەی دانیشتوان زۆرتر نەبوو لە ڕێژەی خۆراکی پاشەکەوتکراو. ئەو دوو بۆچونەی کە مالتۆس خستنیە ڕوو، هەلە دەرچوون. خۆراکی پاشەکەوت کردن خێراتر لەوەی ئەو بیری لێ دەکردەوە زیادی کردبوو، هەندێك بە هۆی لێهاتووی خەلك و هەندێکیش بە هۆی سوود وەرگرتن لە زەویەکانی کیشوەری ئەمریکا، ئو ستراليا، سیبریا و موزچوری.( بگەڕێوە بۆ شۆڕ شی ک شتوکالی لەم زنجیرەیە) دووەم ئەوەی کە دانی شتوانی ئەوروپا و ئەمریکای باکوور بە ڕەوتی هەندەســـی گەشـــەی نەکردبوو. لەو ســـەردەمەی کە مالتۆس کتێبەکەی دەنووســـی، ژمارەی دانی شتوان بە خێرایی گە شەی دەکرد" بەلام لە سەدەی بی ستەم ئەم گە شە کردنە دابەزی، بە تایبەتی لە دوای سوود وەرگرتن لە ئامرازی پێشگیری دووگیان بوون( حامیلە بوون) .**

**لە گەلێ هەموو ئەمانە زۆر خەلك لەو بڕوایەدان بیردۆزەکانی مالتۆس کۆن نەبوونە. لە کاتی گفتۆگۆکردن لە ولاتانی هەژار ناوی مالتۆس هەمی شە ناوی لە نێو ناوانە. لەو ولاتانە ڕێژەی دانی شتوان زۆر بە خێرایی گە شە دەکات بە ڕەوتێکی ئەوەندە خێرا کە مێژوو بە خۆیەوە نەدیوە. ئەم بابەتە زۆر دشـــوار و جیددیە و زۆرێك لەم ولاتانە هێشـــتا نەیان توانیوە ڕێگەیەك بینەوە بۆ زیاد کردنی خوراکی پاشەکەوتکراو. بەلام لە گەلێ ئەوەشدا، ئەوە ڕاست نییە کە دانیشتوان بە ڕەوتی هەندە سی زیاد دەکات و خۆراکیش بە ڕەوتی ژمارەیی گە شە دەکات. هۆکارەکانی هەژاری زۆر ئالۆزترن. ئەم هۆکارانە لە قولایی پێکهاتەی ئابووری ئەو کۆمەلگایانەدایە. ئەو ئەرکەی کە ســـێیەمین ئابورینا ســـی ئەم نامیلکەیە لە ئەســـتۆی کردووە، و ئەرکەکەشی شیکاری ئەم پێکهاتە ئابووریەیە .**

## **کارلێ مارکس (١٨٨٣-١٨١٨ )**

**کارلێ مارکس لە سالی ١٨١٨ لە خێزانێکی جوو( کە دواتر بووە مە سیحی) لە شاری تری یر ( پرۆس- ئەلمانیا) لە دایك بووە. باوکی مارکس پارێزەر بوو. مارکسی لاو خوێندنی دواناوەندی لە شارەکەی خۆیان تەواو کرد و بۆ زانکۆش چووە شـــارەکانی بن و بەرلین. دوای تەواو بوونی خوێندنی زانکۆ دەســـتی کرد بە کاری ڕۆژنامەوانی. ئومێدی مامۆســـتایی زانکۆی هەبوو، بەلان بە هۆی بیری سیا سیەوە ڕێگەیان پێ نەدا. سەرەتا لە سالی ١٨٤٣ لە شاری کۆلین دە ستی کرد بە چاپی ڕۆژنامە، بەلام دوای داخ ستنی ڕۆنامەکەی، چوو بۆ فەڕاز سە. لە سالی ١٨٤٧ نا چارکرا بارگ و بنەی بپێچێتەوە و بچێت بۆ برۆکسیل و لەوێ لە گەلێ فرێدریك ئەنگلیش دەستیان کردە نووسینەوەی بەیاننامەی کومونیستی، کە بانگەوازێك**

بوو بۆ كرێكارانی جیهان. ئەم بەڵگەیە لە ساڵی ١٨٤٧ بڵاوكرایەوە. ماركس لە هەمان ساڵ گەڕایەوە كۆڵین، بەڵام ساڵێك دواتر دووبارە لەوێ وەدەرنرا. دواتر ڕووی كردە لەندەن، باقی تەمەنی لەوێ و لە دەستكورتی و نەداریدا تێپەڕاند. لە لەندەن بوو كە كتێبی سەرمایەی نوو سیەوە كە لە ڕۆژدا لە شوێنی خوێندنەوەی موزەخانەی بەریتانیا و شەوانە تا درەنگانی شەو لە ماڵ خەریكی نوسینەوەی بوو، بەرگی یەكەمی لە ساڵی ١٨٦٧ بڵاو كرایەوە .

مارکس

بەرگی دوەم و سێیەمی ئەو كتێبە لە دوای مردنی لە ساڵانی ١٨٨٥ و ١٨٩٤ لە ژێر چاوەدێری موشتاقانەی ئنگڵیشی هاوكاری بڵاوكرایەوە. كتێبی سەرمایە زیاتر لە هەر شتێك، كتێبێكە زیاتر سەروكاری لە گەڵ بیردۆز هەیە. بەڵام ماركس هەم سەروكاری لە گەڵ بیردۆز هەبوو و هەم لە گەڵ كرداریش. ( فیلسوفەكان بە ڕێگەی جیاواز تەنها شیكاری بۆ جیهان دەكەن، خاڵی گرنگ لێرەدایە كە دەبێ دەست بە گۆڕینی بكرێت!) ماركس لە ساڵی ١٨٨٣ كۆچی دوای كرد .

## كاریگەری خەڵكانی دیكە لە سەر ئەندێشەكانی ماركس

ئەو سەرمایەدارییەی كە ئادەم سمیس موتاڵای كردبوو، لە سەردەمی ماركس كە كتێبەكەی دەنووسی بەتەواوی دەركەوتبوو. هەر لەو كاتەدا كرێكارەكان كە لە كارخانەكانی سەرمایەداری سەرقاڵی كاركردن بوون، لە هەژاری و نەداریدا دەژیان. چینی كرێكاری شارەكان سرنجی ماركسی بۆ خۆی ڕاكێشابوو، بەڵام هەژاری لە گوندەكانی بەریتانیاش بە زەقی دیار بوو. ماركس هەوڵی دەدا لەو سیستەمە سەرمایەدارییە تێبگاو بزانێ ڕۆڵی چینی كرێكار چیە. كاتێك ماركس بە زۆر دورخرایەوە بۆ لەندەن بووە مایەی خێر بۆی، لەبەرئەوەی لەوێدا توانی لەو سیستەمە سەرمایەدارییە چاكتر تێبگات كە لەو كاتەدا سەرمایەداری لە بەریتانیا لە چاو هەر شوێنێكی تر زیاتر دەركەوتبوو .

ماركس بە ووردی لێكۆڵینەوەی لە بیروڕای زانایانی ئابوری بەریتانیا كرد، لەوانە ئادەم سمیس(كە ڕێزی بۆ دادەنا ) و ماڵتۆس كە ڕەقی لێ بوو و پێی دەوت (قەشە ماڵتۆس). هەروەها پسپۆڕیشی لە فەلسەفەدا هەبوو و لە بیروڕای فیلسوفەكانی دەكۆڵیەوە، وەكوو هیگڵ و نووسەرە سۆشیالیستەكان. بە هۆی پشت بەستن بەم لێكۆڵینەوانە بوو كە توانی بیردۆزە نوێیەكەی خۆی لە كتێبی سەرمایە بخاتە ڕوو. هێز، گشتگیری و بەرفراوانی بیردۆزەكەی ئەوەندە زۆرە كە هیچ بیردۆزێك بەر لەو و دوای ئەویش هاوتای نیە و نەبووە .

**شوێنی خوێندنەوە لە موزەخانەی بەریتانیا کە کارڵ مارکس زۆربەی کارەکانی خۆی لێرەدا ئەنجام دا**

## بیردۆزە بنەڕەتیەکانی مارکس

**بە پێی فکری مارکس، مێژوو بە گوێرەی یا سا دەرهاوێ شتەکانەوە دە چێتە پێ شێ. ئەو پێی وابوو کە مێژووی مرۆڤایەتی چـــەند ســـەردەمێکی دیاریکراو دەگرێتە خۆ. وە دەکرا ئەم ســـەردەمانەش بە هۆی شـــێوازی وەبەرهێنانی کاڵاکان، بنا سرێنەوە. ئەو سەردەمەی کە مارکس خۆی تێیدا دەژیا، سەردەمێك کە ئێمە تێیدا دەژین، سەردەمی سەرمایەداری بوو کە مارکس پێی دەووت شـــێوازی وەبەرهێنانی( بورژوازی). مارکس پێی وابوو کە ئەم هۆکارە ئابووریانە دەبنە هۆی**

**هەژاری لادێنشینەکان لە بەریتانیای سەدەی نۆزدە**

ئەندامانی خێزانێکی بورژوازی لە دەیەکانی ساڵی ١٨٦٠

گۆڕانی مێژوو. بیرۆکەکان، دامەزراوەکان، یاســاکان و ســیاســەتەکان هەموویان کەوتونەتە ژێر کاریگەری پایەکانی ئابووری کۆمەڵگا. ئەمە کلیلی تێگەشــتنی خەتە ســەرەکیەکانی مێژووە. بەشــێوەیەك ئەم بیرۆکانە ڕەخنە ناکەنە ناو مێژووەوە، بیرۆکەکانی خۆیان بە سیستەمی ئابووری بە ستۆتەوە. بیرۆکە سەرەکیەکانی هەر سەردەمێك بە ستراوەتەوە بە سوودی ئەو چینەی کە سیستەمی ئەو سەردەمە هەڵدە سوڕێنێ. بیردۆزەکەی مارکس تێگەشتنێکی مادیگەرایی مێژوویە، کە زۆر جار پێی دەڵێن ماتریالیزمی مێژووی. مارکس لە کتێبە بە ناوبانگەکەی (ســەرمایە) ئەندێشــەکانی خۆی زیاتر لە سەر سەردەمی سەرمایەداری چڕکردەوە، و هەوڵی دا ئەوە نیشان بدات کە ئەو سیستەمە چلۆن کار دەکات .

## خەباتی چینایەتی

لە سەر بنەمای ووتەکانی مارکس، کۆمەڵگا دابەش دەکرێت بۆ چینە جیاوازەکان( مارکس بۆ خۆی دەڵێ ئەم بیرۆکانەی لە زانایانی پێش خۆیەوە وەرگرتووە و گەشــەی پێ داوون. م) و بە گشــتی بە درێژایی مێژوو چــینێك، چــینێکی دیکەی چەو ساندۆتەوە، واتە هەمیشە چینێك دە ستی گرتووە بە سەر سوودی وەبەرهێنان بە زیانی چینێکی دیکە. کەم تا زۆر چــینەکان لە گەل یەکتر دژایەتیان هەبووە. بە وتەی مارکس دەرهاویشــتە تایبەتەکانی ســەرمایەداری زۆر زیاتر بوونە لە دژ بە یەکی چــینا یەتی. بە وتەی ئەو، کۆ مەڵگای ســـەر ما یەداری دا بەش بووە بۆ دوو ئوردو گای دژ بە یەك: ســـەرمایەداری(بورژوازی) و پرۆلیتاریا(چــینی کرێکار). بورژوازی واتە ســـەرمایەداران و خاوەن کارگەکان و خاوەن کارەکان (واتە ئەو کەســانەی کە کرێکار حەق دەســتیان ڕۆژانە، هەفتانە یان مانگانە لەوان وەردەگرن) بەڵام پرۆلیتاریا هیچــیان نییە، تەنها هێزی کار نەبێت، و ئەو هێزەشــیان بۆ مانەوەیان لە پای حەق دەســت دەفرۆشــن. پەیوەندی نێوان سەرمایەدارو کرێکار پەیوەندیەکی چەوسانەوەیە، چەوسانەوەی کرێکار لە لایەن سەرمایەدار، و چەوسانەوە پرۆلیتاریا لە

لایەن بورژواز. مارکس دەڵێ، لە کۆمەڵگای ســــەرمایەداری حکومەت لە خزمەت بورژوازیدایە. حکومەت ئامرازێکە بۆ ســــەرکوت کردنی چــینایەتی. ســــەرمایەداری واتە لە پێشــــتر بوونی بورژوازی. بەڵام ئەوە بە هیچ شــیوەیەك بە مانای سەرکەوتنی سەرمایەداری نییە. مارکس پێی وابوو کە سەرەنجام ڕۆژێك دێت کە پرۆلیتاریا سەردەکەوێت .

## سەرکەوتنی چینی کرێکار

بە بڕوای مارکس سەرکەوتنی چینی کرێکار حەتمیە، چونکە پێی وابوو سەرەنجام سەرمایەداری دەڕوخێ. مارکس بەشێك لە بنەماکانی ناو کۆمەڵگای بە هاودژ دەزانی، و پێی وابوو ئەم هاودژ بوونانە دەبنە هۆی ڕوخانی ســــەرمایەداری. بۆ نموونە، سەرمایەداری پشتی بە سوود بەستوە، مارکس پێی وابوو سەرمایە دەبتە هۆی سوود و سەرەنجام ئەم سوودەش کەم و کەمتر دەبێت و لە کۆتایدا دووچــاری قەیران دەبێتەوە. و لە هەمان کاتدا چــینی کرێکاریش هەتا دێت و هەژارتر دەبن و زیاتر مەیلیان بە لای شــۆڕشــدا دەڕوات (دەبی ســـەرنجی ئەوەش بدەین کە بابەتی هەژاری کرێکار بابەتێکی ڕێژەییە. دووهەم ئەوەی کە لە گەڵ پەیدا بوونی ئیمپریالیزم و چەوسانەوەی میلەتانی موستەعمەرە، سەرمایەداری توانی لەم قەیرانە خۆی ڕزگار بکات، توندبونەوەی قەیرانی ســــەرمایەداری لە دوای ڕووبونەوەی زۆری وڵاتانی ســـێ کیشــوەر بەڵگەیە لە سەر ڕاستی قسەکەی مارکس) .

بەرفراوان بوونی ســوود وەرگرتن لە ئامرازە نوێیەکانی پیشــەســازی و دابەش کردنی کار (واتە هەمان شت کە ئادەم سمیس پشتگیری دەکرد) کار ماهیەتی تاکی خۆی لە دەست دەدا. پرۆلیتاریا دەگۆڕدرێت بۆ بەشێك لە ماشێن. لە هەمان حاڵدا کە کرێکارەکان لە کارخانەکان کۆدەبنەوە، وەکوو چینێك، بە ئاگا دەبن، هەڵبەت لە سەرەتا زۆر بە خاوی بەڵام دواتر خێراتر دەبێت. ســـەرەنجام ڕۆژێك دێت کە پلۆریتاریا دەســـت بە شــۆڕش دەکات و جڵەوی حوکمڕانی لە دەســت بورژوازی دەردێنن و بۆ خۆیان دەبنە حوکمڕان. هەمان ئەو گۆڕانکاریانەی کە بورژوازی لە بەرەبەیانی ســــەردەمی

ڕێزڕاوەستان بۆ نان لە شاری نیویۆرك لە کاتی قەیرانی ئابووری لە دەیەکانی ساڵی ١٩٣٠. لەوکاتەدا زۆرێك پێیان وابوو ئیتر خۆی سەرمایەداری ئاوا دەبێ

سەرمایەداری وەدیهێنا، ئەم توانا زەبەلاحەی ئێ ستا داویەتی بە  سەرمایەداری،  سەرەنجام ڕۆژێك دێت کە دەڕوخێت. بە وتەی مارکس، سەرمایەداران چاڵ بۆ خۆیان هەڵدەکەنن.

خێزانێکی کرێکار ١٩١٢ لەو کاتەدا جیاوازی چینی کرێکار و سەرمایەدار لە لوتکەدا بوو.

## سۆسیالیسم و کۆمونیسم

بەو  سەردەمانەی کە یەک سەر دوای  شۆڕ شی کرێکاری لە وڵاتانی پێ شکەوتوو،  سەرمایەداری وەدی دێت پێی دەوترێت  سو سیالیسم. لە  سەردەمی  سو سیالیزم، کەرە ستەی بەرهەمهێنان، و کارخانەکان، بانکەکان، ئامرازەکانی گوا ستنەوە، دەکەوتنە ژێر دەستی خاوەنداریەتی کۆمەڵگا. سامان، بەرامبەر بەو کارەی خەڵك ئەنجامیان دەدا دابەش دەکرا. ئاخرین ئاســتی دەرکەوتنی مێژووی هەمان کومونیســم بوو، کە تێیدا ( هەر کەس بە پێی توانای و هەرکەس بە پێی پێویســتی) حکومەت دەکرێ. حکومەت، ڕێکخراوەکان و ئیدارەکان بە تەواوی دیار نامێنن، و هەموو کەس، هەموو بەرهەمهێنەرەکان بە یەکسانی  و بە ئازادی پێکەوە کار دەکەن. چیتر چەوسانەوە بوونی نابێت .

لینین ڕێبەری شۆڕشی ڕوسیا ١٩١٩ لە کاتی وتاردان بۆ سوپای سوور

## مارکس لە مێژووی جیهان

بیردۆزی مارکس سـرنجی زۆرێك لە خەڵکی بۆ خۆی ڕاکێشـابوو. ئەم بیرۆزە نەك هەر ئەوەی ڕوون دەکردەوە کە لە مێژودا چـی ڕویداوە، بەڵکو وەك موژدە دەرێك بوو بۆ داهاتویەکی ڕۆشـنیش. بیروڕایەکانی مارکس لە تەواوی دونیا دەنگی دایەوە و بوو بەکار و پەیڕەوی بەشێك لە حیزبە سۆسیالیستیەکانیش. ڕوداوەکانی دواتر، دەرکەوتنی ئەم دوایەی سەرمایەداری ئەوەی نیشان دا کە دەرکی بیرۆدزەکەی مارکس بەو ئاسانیەش نییە کە هەندێك پێیان وابوو. سەرمایەداری لە ئەوروپا و ئەمریکای باکوور بەو خێراییە لە ناو نە چوو کە هەندێك بە خوێندنەوەی بیرۆکەکانی مارکس بانگە شەیان بۆ دەکرد. شـۆڕشـەکانی پرۆلیتاریا لە وڵاتانی پێشـکەوتووی وەکوو ئەڵمان و بەریتانیا سـەرکەوتوو نەبوو، بەڵکۆ لە وڵاتانی دواکەوتووی ئەوکاتی وەکوو ڕوسـیا، چـین، کوبا و ڤێتنام... سـەرکەوتوو بوو. بیرۆکەکانی مارکس، شـوێنەکەوتوانێکی زۆری هەبوو، لەوانە لینین، ڕوزالوکزامبۆرگ، ماو، بە هەر حاڵ کاریگەری مەزنی لە جیهاندا جێهێشت .

## ئادەم سمیس، ماڵتۆس و مارکس لە مێژووی جیهان

سمیس، ماڵتۆس و مارکس هەر سێکیان هەوڵیان دا شیکار بۆ جیهانی هاوچەرخ بکەن، و هەروەها هەوڵیان دا پێکهاتەیەك بەدەسـت بێنن لەوەی کە لە داهاتوو ڕوودەدات. هەریەك لەوان لەسـەر بنەمای ئەزمونەکانی سـەردەمی خۆیان شـتیان نووسیوە و هەروەها گومان و تیۆری هەڵەو ناڕاستیشیان باس کردووە. بەڵام هەر یەك لەوان بابەتانێکی بنەڕەتیان خستۆتە

مائوتسه تۆنگ ڕێبەری پێشووی چین، لە دوای ڕووبەڕوبونەوەیەکی ناوخۆیی لە ساڵی ۱۹٤۹ بووە هۆی سەرکەوتنی کومونیستەکان

**ڕوو کە هەم لە سەردەمی خۆیان و هەم لە دوای خۆشیان کاریگەری قوڵیان لە کۆمەڵگادا جێهێشتووە. مارکس و سمیس هەر یەکەیان بە شێوازی خۆیان، چاویان لە داهاتویەکی باشتر بوو. سمیس دەیوت لێگەڕێن خەڵکی ئازاد بێت و بۆخۆیان چـارەی دەردی خۆیان بکەن. لەم ڕێگەیەوە باشـترین ئەنجام نەسـیبی هەمووان دەبێت" و هەروەها بەرهەمێکی دیکە نەسـیبی خەڵکی دەبێت. مارکس دەیوت ئەمە هەڵەیە. ئەگەر خەڵك ئازاد بێت، و هەر کەس چـارەنوسـی خۆی هەبێت، ئەوانەی کە خاوەن سـەرمایەن، ئەوانە دەچـەوسـێننەوە کە تەنها توانای کاریان هەیە. و ئەم نیزامە لە ناودەچـێ، و داهاتویەکی ڕۆشن لە گەڵ نیزامی کومونیستی دێتە پێشەوە. ماڵتۆس هەردووکیانی بە هەڵە دەزانی. ناکرێت چاوەڕوانی داهاتویەکی ڕۆشـن بکرێت، چـونکە گەشـەی دانیشـتوان ژیانی خەڵکی هەمیشـە لە ئاسـتێکی نزمتردا دەهێڵێتەوە. لە کۆتایدا، لەوانەیە گەورەترین ڕۆڵ کە ئەم سێ بیرمەندە هەیانبووە ئەوەبێ کە ئەندێ شەیەکی لە ئێمەدا درو ست کرد کە لەوە تێبگەین هۆکارە ئابووریەکان کاریگەری زۆر قوڵیان لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاو دەرکەوتنی مێژوودا هەبووە.**